# کەڤاڵی وەنەوشە

## چەپکێك شیعر بۆ مناڵان

جەبار سابر

چاپی دووەم سلێمانی ٢٠٠٧

**کەڤاڵی وەنەوشە**

بابەت: شیعری مناڵان

نووسەر: جەبار سابیر

تایپ و هەڵەبڕی: نووسەر

نەخشەسازی و بەرگ: نووسەر

چاپ: چاپی دووەم بەهاری دوو هەزارو حەفت.

چاپخانە: یاد

تیراژ: هەزار دانە

ژمارەی سپاردنی(٣٠٥) وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

**پێشکەشە**

**بە یەکەم مامۆستای سەرەتاییم.**



## پیرەمێرد

**منداڵەکان، ئەم بەهارە**
**کەنەورۆز هات،**
**گەورەکانتان بانگ هێشتبکەن**
**بۆ سەر گردی مامەیارە.!**
**پیرەمێرد لەخەو هەستێنن.**
**چرای ئاشتی بۆ ئەم کوردە،**
**داگیرسێنن.!**
**منداڵەکان،**
**بۆ ئەوەی لە گوناه دووربن،**
**بەرگی شەونم بکەنەبەر.**
**هەر بەشەونم خۆتان بشۆن،**
**خەرمانەی مانگ..**
**بکەنە سەر..!**

## بۆ جەنەڕاڵە دۆڕاوەکان

تفەنگەکان بشکێنن.
لەجێگەی هەر تفەنگێ
گوڵێکی سوور بڕوێنن.
شەڕو ڕق فەرامۆش کەن.!
دڵی منالان خۆشکەن،
تامنالانی کوردیش.
وەك منالانی جیهان،
ببنە چرای ئاینده،
شەڕ نەیان کات سەرگەردان..!



## سمبوڵی کامەرانی

ئێمـەی منالً وەك گوڵین
وەك پەپولەی سەر چڵین.
بیرو هـۆشمان ڕووناکە
دڵ و دەرونمان پاکـــە.
وەکو خونچەی کراوەیـن
زۆر ڕەنگین و ڕازاوەیـن.
سمبوڵی کامەرانـــین
مایەی خۆشی ژیانـــین.
هێمای ئاشتی جیهانـین
دژی شەڕ فـــرۆشانین.
ئێمە منالًین جـــوانین
هیوای هەمـوو جیهانین.

## ئێمه

ئێمه، منالین جوانــین
گوڵی گەشاوەی ماڵــین.
بۆ سەری ساڵی تــازه
دڵمان پڕ خۆزگـەو ڕازه.
بۆ دنیایەکی ڕەنگـــین
دەبینه هەوێنی ژیــن.
دوا ڕۆژی نیشتمانــین
ئامەزرۆی خۆشی ژیانین.
بۆم کوردستــانه جوانه
خـەڵاتمان دڵ و گیانه.



## سەری ساڵ

منالان ســەری ساڵه
جەژنــی ئێوەی منالە.
ئەم جەژنە پڕ سەفایه
زۆر خۆشــە دوایی نایه.
ئێوەش وەرن خێراکەن
خەمی دڵتان بەباکەن.
وەك منالانــی جیهان
گۆرانــی بڵێین بۆ ژیان.
بڵێین: سەری ساڵــی نوێ
لەگشت لایەك پیرۆزبێ.



## منالّه جوانه‌كان

ئه‌ی منالّه جوانه‌كان
گولّی ناو گولّدانه‌كان.
فریشته‌ی نێو به‌هه‌شتن
تابلّێی خۆشه‌ویستن.
ئێوه هێمای ژیانن
وه‌ك په‌پوله نیانن.
ده‌لال و ئێسك سوكن
بێگه‌رد وه‌ك جلی بووكن.
ژیانتان زۆر ڕه‌نگینه
ڕازاوه‌یه‌و شیرینه.
ئێوه نه‌وه‌ی دوارۆژن
بۆ ولاّت تێبكۆشن.



## بانگه‌واز

وه‌رن، وه‌رن، منالاّن
گولّزاری باخچه‌ی مالاّن.
دنیا به‌زم و هه‌رایه
پڕ له ئالاّو والاّیه.
ئه‌م ژینه پڕ ئه‌وینه
لای ئێوه زۆر شیرینه.
وه‌رن، تێر، تێر، هه‌لّپه‌ڕن
خه‌می دلّتان لابه‌رن.
ئه‌مڕۆ جه‌ژن و ئاهه‌نگه
ده‌شتو ده‌ر پڕ له‌ڕه‌نگه.
ئێوه‌ش هه‌موو سه‌ماكه‌ن
مالّی به‌هار ئاواكه‌ن.
هاوڕێ بن بۆ ته‌نگانه
به‌یه‌ك مه‌لّێن بێگانه.
هه‌تا بژین به خۆشی
دوور له‌خه‌م و ناخۆشی.

## بووکە شوشە

بووکە شوشەکـــەم جوانە
وەك خۆم خـــڕو خەپانە.
چاوی شین قـــژی زەردە
دڵی پاك و بێگــــەردە.
ڕەنگی وەك ئەرخەوانە.
دەلالە چاوی جـــوانە.
بۆیە زۆرم خۆشـــــەوێ
هاوڕێمە هەموو شـەوێ.
بەڕۆژ لەگەڵ بووکەکـەم
ماڵە باجێنە ئەکـــەم.



## جەژن

منالان، زووکەن ڕاکـــەن
بۆ ئەم جەژنە سەماکەن.
ئەم جەژنە زۆر دڵگـیرە
بۆ منالی ئاقڵ و ژیـــرە.
ڕۆژی ئێمەی منالـــــە
خۆشترین ڕۆژی ســـالە.
خێراکەن دەی درەنگـــە
کاتی گاڵتەو جەفەنگە.
گۆرانی بڵێن پێکەنـن
بێشکەی دڵتان ڕاژەنـن.

## بووکی جیهان

وڵاتم کوردستـــــانە
گوڵی گەشـــاوەی ژیانە.
شاخی ڕازاوەو جـــوانە
جێگەی گەشت و سەیرانـە.
نیشتمانی ئێمەی کـــورد
خاوەن قەندیل و هەڵگورد.
نەوەی کاوەین بۆ نەبـەرد
هەمیشە بەدەست و بـــرد.
کـــوردستان لانەی شێرە
شوێنـــــی کوردی دلێرە.
ئەم خاکـــە زۆر شیرینە
بەهەشتـــی سەر زەمینە.
بابیپارێزیـــن بەگیان
وەك گلێنەی چاومـــان.
کوردستانی نیشتمـــان
بکەینە بووکـــی جیهان.



## بانگەوازی منالان

گوێ بگرن ئەی گـــەورەکان
لەئێمەی بچکـــۆلەو جوان.
بزانن چەند وشیـــارین
چەند ڕۆح سوکـو نازدارین.
تابڵێی ئـــاشتی ویستین
گەلـــێ لەشەڕ بێزارین.
ئێمە عەشقـــی ژیانین
وەك گـــوڵ ڕازاوەو جوانین.
بەڵام شـــەڕی نێوانتان
ژیانی لـــێ تێکداوین.
شەڕ فوی لە چرای ژین کرد
خەونی ئێمەی لەباربـــرد.

پەڕەی گوڵمانـــی وەران
شوشەی دڵمانی شکـــان.
بەیەك دەنگ هاوارەکـــەین
شەڕکەران بێزارەکەیـــن.
ئاشتی هیوای گـــەلانە
بۆ منالْ مایەی ژیـــانە.



## وەك پەڕەی گوڵین

فریشتەی باخی ژیانـــین
ئێسك سوك و نیانـــین.
ڕەنگ ئاڵین وەك پەڕەی گوڵ
گیان شیرینین لەبـــەر دڵ.
دوا ڕۆژی پـــڕشنگدارین
گەشبینین وەك بـــەهارین.
بێگەرد و پاك وەك بەفرین
بۆ ئازادی دڵ گەرمـــین.
نەوەی کوردی دلێریـــن
ئاشتی خواز و جوامێریـــن.
دۆستی هەموو گەلانـــین
دژی شەڕ فرۆشانـــین.

## چـــــــرا

وەرن تێکـــــڕا منالآن

ڕووناکـــی هەموو مالآن.

شـــکۆفەکـانی ولآت

ئەی نیشانەی خۆرهەلآت.

ئێوە چرای ژیانــــــن

پێشەنگی ڕێی کـاروانن.

ئایندە هی خـــــۆتانە

گەل چاوی لەڕێتــانە.

لەهیچ مەکەن ترس و سڵ

هەتا دەگەن بە مەنــزڵ.



## نەورۆز

بەهــــــارە مناڵەکان

گوڵاڵــە نازدارەکــــان.

ئەی نەوەی کاوەو نەورۆز

بۆم خاکـــــە بن دڵسۆز.

گڕی نەورۆزی ئەمســـاڵ

ببەنە سەر لــوتکەو یاڵ.

بابڵێسەی ئاگــــرتان

بگاتە هەموو ئاسمـــان.

دەبا نەورۆز ئاواکەیـــن.

گیانی شەهیدان شاد کەین.

چونکە ئاگـــری نەورۆز

ئەیدا پێمان هەست و سۆز.

## بارانی بەهار

وەك پەڕەی گوڵ ناسكین
بۆ ڕەوتیش وەك ئاسكین.
گوڵاڵەی دەشت و دەرین
بۆ گەورەكان سەروەرین.
وەك بارانی بەهارین
بۆ ژیانتان دەبارین.
ئێمە هیوای ژیانین
ئارام و میهرەبانین.
باسروشت گەشاوە بێت
بۆ منالْ ڕازاوە بێت.



## بابە نوئێل



ئەوا بابە نوئێل هات
منالاّن دەكا خەلاّت.
بۆ هەموو ساڵێكی نوێ
بابە نوئێل بۆ خۆی دێ.
دیاری جوان، جوان، دەهێنێ
منالاّن دەبزوێنێ.
ئەو منالّەی زۆر ژیرە
لەلای ئەو زۆر دڵگیرە.
دەخێراكەن منالاّن
وەرنە دەرێ لەمالاّن.
بۆ پێشوازی ساڵی نوێ
لەبەریكەن بەرگی نوێ.

## خونچەی بەهار

وەرە پەپولەی نـــازدار
بۆم بێنە خونچەی بەهار.
منیش وەك تـــۆ ڕەنگینم
وەك تۆ عەشقــی ئەڤینم.
وەرە بابفڕین بـــەباڵ
بۆ سەوزایی دەشت و یـاڵ.
لەگەڵ سروشت سەماکەین
خەمی دڵمان بەباکەیـن.
بڕۆین بۆ دیدەنی گـــوڵ
بـۆن کەین بەئارەزوی دڵ.
هاوڕێ بین هەتا ئەژیـــن
ڕق لەیەکتر هەڵنەگریـن.



## دنیای بولبولان



ئێمە هـاوڕێی مەلانین
سەودا ســــەری ژیانین.
حەز دەکەین وەکو مەلان
بچینە با خچـــەی گوڵا ن.
لەگەڵ بولبولی ڕەنگـین
ئەژین ژینێ پڕ ئەویـن.
دڵی یەکتر ناشکێنـــین
شادی و پێکەنین دێنـین.
چونکە دنیـای بولبولا ن
خۆشی ئەدا بەژیـــا ن.

## گوڵزار

وەرن بابڕۆین مناڵان
بۆ گوڵزاری قەد پاڵان.
چۆن بەهار ڕازاوەیە
گوڵێکی گەشاوەیە.
ژیانی ئێوەش وایە
عیشقێکی بێ کۆتایە.
چەندە بێگەردو جوانن
وەکو بەفری کوێستانن.
سروشتان هەر ئەوینە
بزەیەو پێکەنینە.



## وڵاتەکەم

وڵاتەکەم پیرۆزە
لانەی کوردی دڵسۆزە.
ئەم کوردستانە جوانە
جێگەی مادو گۆرانە.
هەتا بڵێی ڕەنگینە
لەلامان زۆر شیرینە.
شاخی سەخت و بڵندی
دەریای بەخورو مەنگی.
دەشت و باخی بەهەشتە
شوێنی سەیران و گەشتە.
حەیفە ئەم کوردستانە
دوژمن بیکات وێرانە.

## شاری یاری

ئەمڕۆ جەژنی منـــاڵە
جەژنی ئێمەی خوێن ئاڵە.
بۆیە ئەمڕۆ دڵخــۆشین
بۆ جەژن بەپەرۆشــــین.
با ... بەیاری و گۆرانــی،
کورسی، کورسی و دیلانــی.
ئەم جەژنە بەسەر بەرین
مەراق و خەم لابەریــن.
بچین بۆ شاری یـــاری
بۆ گاڵتە و گەپ بۆ یـاری.



## گوڵی سوور

مناڵـــینا نەورۆزە
ڕۆژێکـــی زۆر پیرۆزە.
نەورۆزە جەژنی کوردان
جەژنی کاوەی قارەمان.
یـــەکەم ڕۆژی بەهارە
کاتــی گوڵ و گوڵزارە.
مەشخـەڵی گڕ هەڵگرن
بەدڵ خـۆشی دەسـگرن.
وەکو گوڵــزاری بەهار
ڕەنگ بکەن شەقامی شار.
هـەموو ببنە گوڵی سوور
خەم لەدڵتان بکەن دوور.



## خەڵات

منالان ساڵی نوێ هات
باوەری گرین خـەڵات.
دیاری بابە نـــوئێلە
پاکەو بێ فـــڕو فێڵە.
خەڵاتـی جوان دەهێنـێ
منالان دەلاوێنـــــێ.
ئەو خەم خۆری منـاڵە
بۆ منالان عـــەوداڵە.
هەموو ساڵێکی تــازە
دڵی پڕ خۆزگەو نیـازە.
خەندەو پێکەنین دێنـێ
دڵی کەس ناشکێنـــێ.!



## هاورێ

ئەمڕۆ بەزم و ئاهـــەنگە
ڕۆژی یاری و جەفەنگـــە.
بادەست گرین منـــالان
سەماکەین وەکو ســالان.
بادڵی یەکتر خۆشکەیــن
کینەو ڕق  فەرامۆشکەیـن.
هاورێ بین لەم ژیــانە
وشەی هاورێ زۆر جـوانە.
تەنیا بەکــــامەرانی
بەخۆشـــــی و شادمانی
ژیـــــان ئەڕازێتەوە
مرۆڤ ئەحــــەسێتەوە.
دەبا ئێمەی منـــــالان
وەکو چرای نێو مـــالان.
ڕۆشن کەین هەموو وڵات
وەکو کاتی خۆرهـــەڵات.
ببینە ڕێگەی نەجــات
بۆ نەتەوەو بـــۆ وڵات.

## هێمای ژیان

ئەمڕۆ کە سەری ساڵــە.

ڕۆژی شادی منـــاڵە.

مناڵ لەهەموو جیهـان

ئەبێتە چرای ژیـــان.

بەخەندەو بە پێکەنـین

ئەیکەنە هێمای ئـەوین.

مناڵ هەوێنە بۆ ژیــن

ئەو نەبێ ئەمری ئەویـن.

هەر منالان دەتوانــن

مانای ژیان بزانـــن.

داهاتوو ڕوناکتر کــەن

ژیان ڕازاوەتر کـــەن.



## گوڵ

ئەم گوڵە ڕازاوەیـــە

بۆن خۆش و گـــەشاوەیە.

وەك ئێمەی مناڵ جـوانە

هێمای خۆشـــی ژیانە.

پەڕەکانـــی ڕەنگینە

پڕ لەعەشق و ئـــەوینە.

بێگەردە وەکـــو مناڵ

هەر وەکو ئێمەی خوێن ئاڵ.

ئێمەین شکـــۆفەی ژیان

گەشاوەیـــن وەکو گوڵان

بۆنی ژیان خۆش ئەکەین

دڵتان پـڕ خرۆش ئەکەین.



## گوڵی ئەوین

با بچینە باخی گوڵان
بیکەنە بەزم و سەیران.
بەکامی دڵ بۆ یـــاری
دوور لەخەم و بێزاری.
ئەمڕۆ کەچەژنە، جەژنی مناڵە
ڕۆژی بەختیـاری و شادی مناڵە.
وەرن دەسگـــــرین
باتێر هـــەڵپەڕین
جەژن پیرۆزکـــەین
ژین بەسەر بەریـــن.
بەخۆشی بژین، ڕق فـــەرامۆشکەین
بەخەندەو ئەوین، یەکتر دڵخۆشکەین.
بــــاڕازاوە بێت
هەرکـــــراوە بێت
وەك گوڵی ئــەوین
ژین گەشـــاوە بێت.
بەسە بێزاری، خەم و خـــەمباری.
بائیتر بژین بەدڵ ئارامــــــی.





## خوێندن

بخوێنن دەی بخـــوێنن.
تاچیتر، دانـــــەمێنن.
بەخوێندن و بەنوســـین
دائەگیرسێ چـــرای ژین.
بـــەزانست و پێشکەوتن
ئەڕۆین بـەرەو سەرکەوتن.
بائاوای کەیـن خوێندنگا
وەك حەرەمـــی پەرستگا .
با مــــامۆستا ڕابەربێ
ئەو هـــەمیشە سەروەربێ.
هەر ئەو ئەیبەخشێ پێمان
زانست و ڕەوشتی جـــوان.

## سەرکەوتن

ئێمەین گوڵـــــــی ڕازاوە
بۆنی خۆشمان بـــــڵاوە.
جوانین چون نمەی بـــاران
وەك گوڵاڵەی كـــــۆساران.
بێگەرد وەك بەفری چیـــا
چاو نەترس گورج و وریـــا.
گەلێ ڕاستگۆو لەسەر خۆین
بەرەو سەربەستی ئەڕۆیـــن.
داهاتووی كوردستانـــــین
وەك شێری بێشەلانـــین.
ئەڕۆین بەرەو پێشكەوتـــن
بەرەو لوتكەی سەركەوتـــن.



## بەفر

ئەوا بەفر دەبـــــاریٚ
وەك لۆكە دێتە خـــــواریٚ.
حەوشەو ماڵ بیگەرد دەكـا
فەرشی سپی ڕادەخــــا .
وەرنە دەریٚ منــــالاّن
با یاری كەین وەك ســالاّن.
با ئەو بەفرە تۆپەڵكەیـن
دەست و پەنجەمان سڕكەین.
مەڕۆنەوە بۆ ماڵـــــیٚ.
هەتا بەفر دەبـــــاریٚ.
باشێرە بەفرینە كەیـــن
تاویٚ دڵ ئاسودە كەیـــن.

## قوتابخانە

وا ساڵی نوێ گەڕایـــەوە
کاتی پشوو بــــڕایەوە.
با بڕۆینەوە بۆ قوتابخانە
بۆ فێربونـــی پەندو وانە.
قوتابخـــانە زۆر خۆشە
چونکە دڵمـان پێی خۆشە.
جێی فەرهەنـــگ و زانستە
زۆر خۆشـــە وەك بەهەشتە.
با بەبیر و هـــۆشی ورد
زۆر بەپەلەو دەست و برد.
با بەزانست و عیرفـــان
بچینە هەواری گــــەلان.



## ئەوین

ساڵی نوێ واهـاتەوە
خەمی دڵ دەباتـــەوە.
وا بابە نوئێل دیـارە
لەسەر شەقامی شـارە.
گوڵی شادی و پێکەنـین
ئەدا لەبەرۆکی ژیـــن.
منالان دەوروژێنـــێ
خۆشی بەدڵیان دێنـــێ.
دەی بەچەپڵەو پێکەنین
ببنە گوڵی پڕ ئەویـــن.



## بەهار

مناڵان جەژنە ئەمــرۆ
بڕۆنە پێدەشت و کــۆ.
هەروەك گوڵاڵە ســوورە
کەچەند شادو ڕوو سوورە.
ئێوەش وەرن دەست گــرن
گوڵی پێکەنین بگــرن.
لەسەر سەوزە گیای بەهار
سەماکەن بۆ یادگــار.
بژین بۆ شادمانــی
بەخۆشی و کامەرانــی.





## کوردستان

کوردستان ئــەتپەرستم
تەنیا تۆی خــۆشەویستم.
خۆشەویست تر لەگیــانم
هەر تۆی سەرمایەی ژیانم.
مایەی ئاسودەی گیانــی
بۆ تۆ ئەبمە قوربانــی.
هەتا لەژینا مــاوم
ئەت پارێزم وەك چــاوم.
سەربازی ڕێــی وڵاتم
هەر بۆ تۆیە خــەباتم.
ئەی بەخشم پێت دڵ و گیان
تۆی ئامانجم لەژیــان.

## داهاتوو

گوڵم، گوڵــی رازاوە
خونچەی تــازە کراوە.
ڕەنگم وەکــو بەهارە
سوورەو لە دوور دیــارە.
من داهاتــوی ڕەنگینم
هێمــای بێگەردی ژینم.
چەلەنگم لە تێکۆشان
بۆ سەرکەوتن لە ژیان.
دڵسۆزی نیشتمــانم
شیرین ترە لە گیـــانم.



## قەڵەم

من و قەڵەم دوو هاوڕێین
هەردەم بۆ یەکتر ئەدوێین.
من ئەیڵێم ئەو ئەنوسێ
دڵمان لەیەك نابوغزێ.
لەپۆلا ئەو هــاوڕێمە
لەماڵەوەش هــەرپێمە.
ئەیخەمە ناو گــیرفانم
ئەی پارێزم وەك گیانم.
قەڵەم هەر بـۆ زانستە
هێمای بـەرزی ڕەوشتە.



## مامۆستا

بەیـانیان زوو هەڵئەستم
بەهیواو بەمـــــەبەستم.
دوای خۆگۆڕین نان خواردن
کەمێکیش وەرزش کــردن.
جانتا ئەکەمە شـــانم
بەرەو لای هاوڕێکـــانم.
ئەڕۆم بۆ قوتابخـــانە
کەتاقیگەی ژیانــــە.
وانەی تازە وەرئەگریـــن
رێز لە مامۆستا ئەگریـــن.
قەت نایکەینە دەنگە، دەنگ
بەژاوە، ژاو و جەفــەنگ.
کەمامۆستا لێی پرســین؟
یەك، یەك پەنجە هەڵئەبڕین.
مامـــــۆستا وەك ڕابەرە
هەرخۆی گـــەورەو سەروەرە.



## وێنە

من ئەی کێشم وێنەی جوان
بۆ جوان کردنی ژیـــان.
بەو هونەرەی ئــەینوێنم
وێنەی گوڵ ئەنــەخشێنم.
بەم پەنجە ناسکانـــە
بەم فڵچە بچکـــۆلانە.
ئەم ســـروشتە ئەدوێنم
ڕازی خـــۆم ئەدرکێنم.
بۆ ئەوەی ژیانی خـــۆم
پرشنگداربێ وەکـــو مۆم.
دەی ئێوەش فــڵچە بێنن
وەك من هونـــەر بنوێنن.
بەدەست و پەنجەی خۆتان
بینەخشێنن وێنەی جـوان.
پەپولەبێ یاخود گـــوڵ
کەخۆشـــــی بدا بەدڵ.



### باخچە

باخچەی ماڵمان ڕازاوەیــــە
پڕ لەگوڵی گەشـــــاوەیە.
وەنەوشەو بەیبون تێکـڵاوە
نێوانیان گوڵــــــی لاولاوە.
لەبەهارا وێنەی بـــــووکە
شۆخ و شەنگ و ڕەزا سوکــە.
باخچەکەمان ئاوەدانـــــە
خونچەی بۆنخۆشی ژیـــانە.
هەمیشە هەر سەوزو جوانە
بۆ ئارامـــــی دڵ و گیانە.







### کۆلارە

بفڕە، بفڕە کــــۆلارە
دنیا لە بەرزی دیـــــارە.
سەرکەوە بۆ ئاسمــــان
بۆ شاری ئەستێرەکــــان.
بیبە لەگەڵ خۆت بۆیــان
ڕازی ئێمەی منـــــاڵان.
لەو بەرزییە کە دیــارە
دنیا چەشنی بەهـــــارە.
زەمین بەگوڵ خـــەملیوە
کێ دیمەنی وای دیـــوە.
بفڕە تا هەوا مـــــاوە
تا دوورایی بۆ چـــاوە.
کەتۆ ئەڕۆیتە ئاسمـان
خەم بارئەکات لە دڵمان.



## سەیران

وەرن بـــابچینە سەیران

بۆ ناو باخ و دەشتی جوان.

بەهـــارە دەشت ڕەنگینە

تابلۆیەکـــی نەخشینە.

زەمین بەگـــوڵ ڕازاوە

گشت ڕەنگێ تێکـــەڵاوە.

دەبا بـــڕۆین مناڵان

ژینمان نەدەین بەتـاڵان.

لـەو گوڵزارە یـاری کەین

جێی یاریمان دیاری کەین.





## کۆتر

کۆترەکەم سپی و جوانە

وەکـــو بەفری شاخانە.

هێمایـــە بۆ بەختیاری

بۆ ئاشتـــی و بۆ ڕزگاری.

ئەفڕێ بـەرەو ئاسمان

پەیام ئەبـا بۆ جیهان.

سرودی ئاشتـی ئەچڕێ

گۆرانی بۆ ژیـــن ئەڵێ.

کەئەدا لەشەقـەی باڵ

من ئەچمە دنیای خەیاڵ.

## کتێب

ئەم کتێبەی وا پێمــە
چرای ڕوناکی ڕێمـــە.
دەستم ئەگــرێ بۆ زانین
بۆ ڕێزگــرتـن بۆ ئەوین.
فێرم ئەکـا مانای ژیان
مانای خۆشبەختی ئینسان.
ئەو هەوێنە بــۆ گۆڕان
بۆ پێشکەوتن لــە ژیان.
خۆم قەرزاری ئـــەزانم
هەتا مـــاوە ژیانم.
ڕێگایە بۆ پێشکـــەوتن
بۆ بەختیاری و سەرکەوتن.





## پێکەنین

پێکەنـــە دەی پێکەنە
خـــەم لەدڵت هەڵکەنە.
بەزەردەخـــەنەو قاقا
بە گاڵتەو گەپ بەسەما.
دڵ و دەرونتان خۆشکـەن
زەردەخەنە دابەش کـەن.
گەمەو یاری و پێکەنین
ژیانێکی پڕ ئەویـــن.
بۆ ئێمەی منداڵــی جوان
قاقایە سەرمایەی ژیـان.

## گەشتی سەرچنار

سەیرانە وەرزی بـەهار
بابڕۆین بۆ ســـەرچنار.
بۆ سەیری بـاڵندەو گوڵ
هەتا ئاســـودەبێ دڵ.
کەدەبیبینین چەند جوانە
بـــۆ ئێمەی منالانە.
کورسی، کورسی و جۆلانە
سواربوونی چەند ئاسانە.
هێند سواری قیتار ئەبین
هەتا لێی بێزار ئـەبین.
ئینجا بە خـــلیسکێنە
بەیاری، باز بـازێنە.
بەڕاکردن سەرەوخـــوار
بۆ ناو گـــوڵجاڕی بەهار.





تاجەستە مــاندو ئەبێ
ئاسۆ لەچــاو ون ئەبێ.
تائەستێرەی ئـاسمان
شار ئەکاتە چـــراخان.
ئەوسا ئیتر بەرەو مــاڵ
بەنوکتە بازی و خەیـاڵ.
بەدڵێکی پڕ ئەویــــن.
سەرئەنێینە سەر سەریـن.
وایە گەشتی سەرچـنار
گشت ساڵێ وەرزی بەهار.

## کاوە

نـــەورۆزە، نەورۆزە
جەژنـــی نەتەوەو هۆزە.
ڕۆژی گـەشت و سەیران
دنیا ڕەنگـین و جوانە.
دەشت و دەر ڕازاوەیـە
وەك خونچەی كراوەیە.
باكۆمەڵێ ببەســـتن
چیتر ئاوا نەوەســـتن.
بەپرشنگی ئاگــرمان،
شار بكەینە چراخـان.
بەرگی جوانتر بپۆشـین
تابزانن دڵخۆشـــین.
تابزانن، كە.. كـاوە
زوحاكی لەگــۆڕ ناوە.
بڵێن: سڵاو لـــەكاوە
سڵاو لـــەگیانی كاوە.
كــە نەورۆزی داناوە..!



## گوڵاڵەی كوێستان

من گوڵاڵەی كوێستانـــم،
ڕەنگ سوور و شادمـــانم.
هـاوڕێ هەنگ و پەپولەم،
زۆر قەشەنگ بچكـــۆلەم.
كـــوڵم سوری خوێن ئاڵم،
مناڵێكـــــی چاو كاڵم،
بێگەردە دڵـم وەك گـــوڵ،
من دەلالترم لە گــــوڵ.
هیوام خۆشـــی و ئەوینە،
خـــەندەیەو پێكەنینە..!

## چوار پەپولە شیعر

من پەپوولـەم خۆش دەوێ،
دڵ لـــەدووری ناسرەوێ.
بەباڵـــی ڕەنگاو ڕەنگی،
بەهاتوچۆی بێ دەنگـــی.
ئەمباتە دنیای ئەویـــن.
دنیای بەزم و پێکەنـــین.
ئەڕۆین بۆ دنیای خـەیاڵ،
بۆلای گوڵاڵەی چاو کـاڵ.
ئەو هەمیشە ئەمدوێنـــێ،
هەرگیز دڵم ناشکێنـــێ.
گۆرانی بۆ ژین ئەچریـــن.
تا بەئازادی بفڕیـــن.





وەك پەپوولەی بەهەشتـــین
عیشقی سەیران و گەشتـــین.
بۆلای تاڤگەو ئاوی خـــوڕ
ئەڕۆین لەم چڵ بۆ ئەو چڵ.
ئێمەی منداڵ جـــوانین
هیوای هەموو جیهانـــین.
بۆ مەنزڵی سەرکـــەوتن
وەك ئاسکـــی بیابانین.
وەك گوڵ و خونچەو چرۆین
دوژمنی شەڕو درۆیـــن.
بۆ ئاشتی و پێکەوە ژیان
هەموو بۆ یەك ڕێ ئەڕۆیـــن.



ئەم پەپولـــــە جوانە
وەك من حـــەزی لە ژیانە.
توخوا دڵــــی مەشكێنن
باڵــــی هەڵمەوەرێنن.
ئەویش هەر عەشقی گوڵە
وەك من شەیداو سەرچڵە.
باڵەكانــــی نەخشینە
زۆر تامـــەزرۆی ئەوینە.
هەمیشە لــــەگەڕانە
لەناو باخ و گــــوڵانە.
پەپولـــە زۆر ڕەنگینە
تاحەزكـەی پاك و جوانە.





ئەی پەپوولەی باڵ نەخشــین
دڵ پڕ لەشیلەی ئەویـــــن.
كوێت حەزلێبێ بۆی دەفـــڕی
لەشوێنێ ئارام ناگـــــری.
ئەزانــــــی من مناڵـــم
وەك تۆم بەڵام بێ باڵـــم.
منیش حەز دەكەم بفـــڕم
لەجێیەك ئارام نەگـــرم.
تەمـــەن كورتی خۆشەویست
ژین تۆی پێویستە، پێویست.



## ئەستێرە

ئەی ئەستێرەی گەش و جوان
رۆشــن کەرەوەی ئاسمان.
چــراخانـی شەوی تار
عەشقـی شەو لەرۆژ بێزار.
هـاوڕێـی مانگی تۆ بەشەو
چـاوت قەت ناچێتە خەو.
حەزمکــرد منی منالّ
لای تۆ دروستیکــەم مالّ.
بەلاّم تۆ هەر بەشــەوان
دەرئەکەوی لەئاسمــان.





## رۆژی منالاّنی جیهان

واجەژنــی منالاّنە
شادی لــەدلّ میوانە.
ئەمرۆ لەهەمــوو جیهان
جەژنە ، جەژنـی منالاّن.
ئێمەیش لەم کوردستـانە
ئەی کەین یاری و جۆلانە.
ئەی گۆڕین جل و بەرگمان
ئـەرۆینە گەشت و سەیران.
بابــزانن گشت جیهان
کەئێمـەیش لەکوردستان
هەموو ســالّێ لەم ڕۆژە
ئەیکەین جەژنە پـیرۆزە.



## پرشنگی خۆر



ئێمەین وەك پرشنگی خۆر
تاریکی شەو ڕاودەنێین.
بەسەر خەمی ژیانا
خۆشی دڵمان ناو دەنێین.
کەگزنگی بەیانی
ئەیدا لەپێدەشتی جوان
کەخۆری کامەرانی
ڕۆشنییەکا گشت جیهان.
ئێمەیش دێین بەقاقاوە
خۆشی ئەدەین بەژیان.



## کەروێشك



کەروێشکی جوان و خرپن
گوێ قوت، بچکۆلە، توکن.
کەئەڕۆی بە قونە، قون
چەند جوانە لێت شنەشن.
وەرە بۆ باوەشی من
وەك خۆت خرپن و گوپن.
حەز ئەکەم هاوڕێی تۆبم
تاوەك تۆ لەسەر خۆبم.
یاری کەین و هەڵپەڕین
تاهیلاك بوون نەسرەوین.
تۆ کەروێشك و من مناڵ
ببینە گوڵی ناو ماڵ.

## ئاهەنگ

سەیرکەن ئەم ئاهەنگە
چەند جوان و ڕەنگاو ڕەنگە.
لەگشت لاوە منالاّن
هاتوونە دەر لەمالاّن.
خەملێون وەك گولاّلە
چوون بەهاری ڕازاوە.
هەموو شادو دڵخۆشن
بۆ خۆشی بەپەرۆشن.
جەژن و ئاهەنگ دەگێڕن
گولّ بۆ یەکتر دەنێرن.



## گوڵی دوا رۆژ

جەژنە، جەژنە، منالاّن
پەپولەی جوانی مالاّن.
دەستگرن لە بۆ یاری
هاوڕێ بن بۆ بەختیاری.
خۆشی دڵتان بنوێنن
وەك بولبول بجریوێنن.
هەر وەك گولّی ڕازاوە
بینەخشێنن ئەم ناوە.
ئێوە گولّی دواڕۆژن
خاوەنی هەست و هۆشن.

## بزە *

منداڵــــین و چـــالاكـــین
وەك پەپوولە دڵپاكـــــــین.
لەگەڵ تاڤگەی ئاوی شـــین
بزەیـن بۆ سەر لێوی ژیـــن.
وەك چۆن هەنگ بۆلای گوڵا ن
ئێمەیش ئەڕۆین بۆ گـــــەڕان.
كاتێك ئەچین بۆ مـــەكتەب
دائەنیشن بـەئـــــــەدەب.
بۆ پەروەردەو بۆ زانـــــین
گوێ دەگرین لەمامـــــۆستا.



كەزەنگی پشوو لـــێدرا
دیێنە دەر بۆ گـــــۆڕەپان
تێكـــڕا وەك خوشك و برا.
بۆ یاری و بۆ هەڵپەڕكـــێ
لەگەڵ یەك ئەكەین سەمـــا.
بۆ سەربەستـــی و بۆ ژیان
دائەگیرسێین وەك چـــرا..

## بۆ وڵات

گوڵی باخچەی ئـــاواتین
ڕووگەشین و دڵپاکــــــین.
ئێمە نەوەی دواڕۆژیـــن
بۆ وڵات بەپەرۆشـــــین.
کەمامـــۆستا هاتە پۆل
ئیـــتر نایکەین بۆڵە بۆڵ.
لـەگەڵ مامۆستای دڵسۆز
هەوڵەدەین بۆ گەل و هۆز.
هـــــەتا ڕۆژی ڕزگاری
سەرکەوتنی یەکجـــاری.
بۆ بەرزی ئەم وڵاتـــە
دڵ و گیانمـــان خەڵاتە.



## ئاشتی

گەورەکـــان بمان دوێنن
وەکو هەنگ و پەپولـــە.
دیاری جوانمان بۆ بێنن
شەڕ گـــرفتاری کردوین.
هیوای ئێمە ئاشتـــی یە
چیـــتر دڵمان مەشکێنن.
گـــەورەکان بمان دوێنن
واز لە شەڕو شـــۆڕ بێنن.
بۆ بەهاری ئـــــازادی
ئاشتی بۆ هەموان بێنن

## شەونم

وەك شەونمی بەهاریـــن
دۆستی گوڵ و گوڵزاریـــن.
پەپولەی ئەم سروشتەیـــن
فریشتەی ئەو بەهەشتەین.
شەڕ لەگەڵ یەكتر ناكەین
بەبێ یەكتر هەڵناكەیـــن.
ئەڕۆین بـۆو دەشت و دەرە
دڵمان عەشقـــی سەفەرە.
ئێوەش دڵمـــان مەشكێنن
هیوامان مەتـــــۆرێنن.
مناڵیش نیشتمـــــانە.!*
پاكە، بێگەردە، جـــوانە.

*دێرە شیعرێكی بۆدلێری شاعیری فەڕەنسایە.



## هیوای دوا رۆژ

مناڵی ژیرو جوانـــــین
خۆشەویستی هەموانـــــین.
وەك گوڵ بێگەردو پاكـین
لەتێكۆشان چالاكـــــین.
فریشتەی باخی ژیانـــین
ئارام و میهـــــــرەبانین.
تینوی ئاشتی و بەختیارین
نەوەی كوردین وشیاریـــن.
ئێمە هیوای دوارۆژیـــن
بۆ كوردستان دڵسۆزیـــن.

## لەگەڵ بولبول



وەرە هاورِێ بین بولبول
بفرِین لەم چڵ بۆ ئەو چڵ.
بابدەین لەشەقەی باڵ
تۆ بۆخۆت من بۆ خەیاڵ.
منیش وەك تۆ جوانم
دڵ پاکم خۆشخوانم.
با هاورِێ بین تاژیان
پرِ ئەبێ لەپێکەنین.
گۆرانی ئاشتی بڵێین
بۆ سەربەستی و بۆ ئەڤین.



## مناڵێکی بچوکم



مناڵێکی بچوکم
بێگەردو ئێسك سوکم.
لەماڵەوە خاوێنم
رەوشتی جوان ئەنوێنم.
لەدەرەوەو لە کۆڵان
هاورِێم لەگەڵ مناڵان.
شەرِ ناکەم لەگەڵ هیچ کەس
رێز دەگرم لەهەموو کەس.
خۆشەویستن هاورِێیان
ئاسودەبن هەمووتان.

## خۆناساندن



من منداڵێکـــــــی جوانم

پاك و خـــــاوێنە گیانم.

قسەی خۆش ڕەفتاری جوان

سەرمەشقمە لە ژیـــــان.

خۆم لەکەس توڕە ناکــەم

کاری ناپەسەند ناکــەم.

خاوەنی هۆش و بـــیرم

بۆیە وا ئاقڵ و ژیــــرم.

دایك و باوکم خۆشـدەوێ

ئـــــەوانیش منیان دەوێ.



## قوتابخانەی نوێ

ئەمڕۆ ڕۆژێکی نوێیە

وەرزی بەهار لەڕێیە

ڕۆژی کردنەوەی فێرگەو

زانینگەیەکی نوێیە

خوێندنگەی قڕگەی تازە

بۆ ئێمە دەرگای وازە

بۆ فێربوونو پەروەردە

بەشێوازێکی تازە

لەئەم خوێندنگە نوێیە

مامۆستا چرای ڕێیە

ئێمەی قوتابی کوردیش

نامەی دواڕۆژمان پێیە.

قڕگە گوندێکی خۆشە

ئێمەیش دڵمان پێ خۆشە

ئێمە بۆی تێدەکۆشین

ئەویش بۆمان پەرۆشە.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی من**

*پروشە . شیعری منالان . ١٩٩٨

*کەڤاڵی وەنەوشە شیعری منالان ٢٠٠٠

*گۆرانییەکی قژ زەرد. شیعر .٢٠٠٢

*ئەو منالەی دوێنێ گریا. ستونی رۆژنامەوانی ٢٠٠٤

*چرپەچرپی ئەو دیو ئازادییەکانی ژن . وتار ٢٠٠٤

*بەهەشتێ لەکاغەز . ستونی رۆژنامەوانی . ٢٠٠٥

*دلۆپە . شیعر . ٢٠٠٥

*بیبلیۆگرافیای چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری بۆ ساڵی(٢٠٠٤). ٢٠٠٥

*بچووکبوونەوەی ئینسان ستونی رۆژنامەوانی ٢٠٠٦

*باویلکە شیعری منالان ٢٠٠٦

*بیبلیۆگرافیای چاپکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپو بلاوکردنەوە. بۆساڵی(٢٠٠٥) ٢٠٠٦ .